# فێربوونی زمانی

# PHP




ئامادەکردنی : ابراهیم قادر مصطفی باڵەکی | 2023

## پێشەکی

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْماً (طه:١١٤)

صدق اللّهُ العظيم

سووپاس و ستایش بۆ پەروەردیگاری جیهان کە تەمەنیدام بتوانم لەو زانستەی کە پێیبەخشیوم بتوانم کتێبێکی کوورت بنووسم لەسەر زمانی PHP و لەگەل بەکارهێنانی چەند سەرچاوەیەکی بیانی، PHP کە زمانێکی پرۆگرامسازیە و لە رێیەوە دەتوانرێت چەندین سیستەم و وێبسایت و پرۆگرامی لێوە درووستبکرێت.

**ابراهیم قادر مصطفی** : تەمەنم 25 ساڵە و خەلکی ئیدارەی سەربەخۆی سۆرانم و بە عەشیرەت (باڵەکیم) .

لەم کتێبەدا باسی چەندین کردار و نووسینی کۆدەکانی زمانی PHP کراوە و بە نموونە روونکردنەوەی لەسەر دراوە بۆ ئاستی سەرەتای زۆرباشە بۆ فێربوونی زمانەکە .

ئەم کتێبە بەشێوەیەکی خۆرای بەردەستە بۆ هەموو خوازیاران کە بیانەوێت سوودی لێوەربگرن و فێری چۆنیەتی نووسینی کۆدەکانی زمانەکە ببن .




*Facebook Profile*

# ناوەرۆک

## PHP چیە ؟

( PHP ) زمانێکی ستانداردی پرۆگرامسازیە ، کە لە ئاستێکی بەرزی پرۆگرامسازی دایە ، لە سەرەتادا لەلایەن پرۆگرامەری دانیمارکی–کەنەدی ڕاسموس لێردۆرف لە ساڵی 1993 دروستکراوە و لە ساڵی 1995 بڵاوکراوەتەوە، بۆ ئەوەی بتوانیت ئەم زمانە بە باشی بزانیت پێویستە (HTML و CSS) بە درووستی بزانیت، لە ڕێگای بەکارهێنانی (PHP) دەتوانی ماڵپەڕەکەت (بزۆک dynamic) بکەیت، واتە کاتێ بەکارهێنەری جۆربەجۆر لە کاتی جۆربەجۆردا سەردانی ماڵپەڕەکەت بکەن ئەوا دەرەنجامی جۆربەجۆر دەر دەکەوێ لە سەر ماڵپەڕەکەتدا ، سادەترەین نموونە لەسەر ئەم بابەتە بۆ نموونە گەر بتەوێت ماڵپەڕێکت هەبێت کاتژمێری لەسەر بێت ئەگەر بە کۆدی (HTML) بنووسی کاتژمێر (12:30)، ئەوە تەنها یەک جار لە شەووڕۆژێکدا ڕاستە و لە کاتەکانی تردا ڕاست دەرناچێ، بەڵام لە(PHP) دا هەموو کات ڕاست دەر دەچێ و کاتەکەت بە ڕاستی و ڕاستەوخۆی نیشان دەدات .(PHP) زمانێکی سکریپتە کە لەسەر سێرڤەرەکان کاردەکات و زۆرجار بۆ دروستکردنی ماڵپەڕ بەکاردێت. یەکێکە لە زمانە بەرنامەسازییە بەناوبانگەکان بۆ دروستکردنی بەرنامەی وێبی داینامیکی. (PHP) بۆ گەشەپێدەرانی هەموو ئاستەکانی ئەزموون بەردەستە چونکە سەرچاوە کراوە و بەکارهێنانی بێ تێچوونە. دەتوانرێت (PHP) ڕاستەوخۆ بخرێتە ناو کۆدی (HTML)، ئەمەش وایکردووە بە تایبەتی بۆ پەرەپێدانی وێب گونجاو بێت. سەرەڕای ئەوەش، (PHP) پشتگیری لە ژمارەیەکی زۆر لە بنکەدراوە دەکات، وەک(MySQL و Oracle و PostgreSQL) ئەمەش وایکردووە کە ئامرازێکی بەهێز بێت بۆ دروستکردنی بەرنامەی وێبی ئاڵۆز.

*PHP LOGO*

## پێداویستیەکان :

1. دەستکاریکەرێک بۆ نوسینی کۆدەکان

- NotePad++
- Bluefish
- Geany
- Gedit
- Medit
- VIM

2. PHP وەک و زمانەکانی تر نیە راستەوخۆ کاربکات بەلکوو پێویست بە سێرڤەرێک دەبێت بۆ دانانی فایل و داتاکانت لەسەری تاکوو بتوانیت لە براوسەردا کاری پێبکەیت بۆ ئێمە ئەتوانین بەرنامەی XAMPP دابەزێنین و لەرێگایەوە کار بە PHP بکەین .
3. PHP وەک و زمانەکانی تر نیە لە هەر شوێنێک خەزنی بکەیت کارت بۆ بکات بەلکو دەبێت برۆیتە نێو درایڤی C لەوێ بەدوای فۆلدەری xampp دا بگەرێیت کاتێک کە فۆلدەرەکەت کردەوە دەبێت داتا و فایلەکانت لەنێو فۆلدەری htdocs دا دابنێیت . لەو کاتەدا لە رێگای بەرنامەی xampp دەتوانین کار بە PHP بکەین و کۆدەکانمان بنووسین و ماڵپەرەکەمان ببینین .
4. خەزن کردنی فایلەکانی PHP دەبێت بە پاشگری (.php) بێت .

## PHP دەتوانێت چی بکات؟

- PHP دەتوانێت ناوەڕۆکی لاپەڕەی داینامیکی دروست بکات
- PHP دەتوانێت فایلەکان لەسەر سێرڤەرەکە دروست بکات و بیکاتەوە و بیخوێنێتەوە و بنووسێت و بیسڕێتەوە و دابخات.
- PHP دەتوانێت داتای فۆرم کۆبکاتەوە.
- PHP دەتوانێت کووکی بنێرێت و وەربگرێت.
- PHP دەتوانێت داتا لە داتابەیسەکەتدا زیاد بکات، بیسڕێتەوە، دەستکاری بکات.
- دەتوانرێت PHP بەکاربهێنرێت بۆ کۆنترۆڵکردنی دەستگەیشتن بە بەکارهێنەر.
- PHP دەتوانێت داتاکان کۆد بکات.

## بۆچی PHP بەکاربهێنین ؟

- PHP لەسەر پلاتفۆرمە جیاوازەکان (ویندۆز، لینوکس، یونیکس، ماک ئۆ ئێس ئێکس و هتد) کاردەکات.
- PHP لەگەڵ نزیکەی هەموو ئەو سێرڤەرانەی کە ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێن (Apache, IIS و هتد) دەگونجێت.
- PHP پشتگیری لە کۆمەڵێک بنکەدراوەی بەرفراوان دەکات.
- PHP بەخۆڕاییە. لە سەرچاوەی فەرمی PHP دایبەزێنە: www.php.net
- فێربوونی PHP ئاسانە و بە شێوەیەکی کارا لە لای سێرڤەر کاردەکات.
- PHP بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکاردەهێنرێت.

## دروستکردنی پەڕەیەکی PHP :

کۆدەکانی php هەموو کات لەنێو کۆدەکانی html دەنووسرێت، بۆ نووسینی کۆدەکانی PHP دەبێت سەرەتا بە تاگی <?php دەستپێبکەین و بەوجۆرە ?> دای بخەینەوە .

بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت بنووسین Ibrahim Qadir :

```
<html>
<body>
<?php
$txt = "Ibrahim Qadir";
echo " Slaw Barez : $txt ! ";
?>
</body>
</html>
```

Output:

```
Slaw Barez : Ibrahim Qadir !
```

گرینگترین شت لە php دا نوسینی (;) سیمی کۆلۆمە لە کۆتای کۆدەکانت ، لەهەر حالەتێک دا ئەگەر لەبیرتچوو ئەوا ئیرۆرت نیشان دەدات و کۆدەکانت رەن نابن ، بۆ پێشاندانەوەی داتاکانت لەنێو ماڵپەڕەکەتدا پێویستە لە ڕێگای (echo) بانگیان بکەینەوە .

## خشتەی ریزەدەربازبووەکان [ escape sequence ]

| ووشەکان | کوردی |
|---|---|
| \n | بۆ چوونی هێڵەکان بۆ هێڵی نوێ |
| \t | بۆ دانانی بۆشایی زۆر |
| \ | بۆ دانانی باک سلاش |
| \" | بۆ دانانی هێمای " |

## کۆمێنت دانان :

لە PHP دا دەتوانیت دوو جۆر کۆمێنت بەکاربهێنیت: کۆمێنتی تاکە دێڕ و کۆمێنتی چەند دێڕ.

1. کۆمێنتی تاک دێڕ:

کۆمێنتە تاک دێڕییەکان بە `//` دەست پێدەکەن و تا کۆتایی دێڕەکە درێژ دەبنەوە. بۆ کۆمێنتکردن لەسەر یەک دێڕ بەکاردەهێنرێن.

```
// This is a single-line comment
```

2.کۆمێنتی فرە دێڕ:

کۆمێنتە فرە دێڕییەکان بە `/*` دەست پێدەکات و بە `*/` کۆتایی دێت. دەتوانن چەندین دێڕ ببرن و زۆرجار بۆ کۆمێنتی درێژتر یان کۆمێنتکردنی بلۆکی کۆدەکان بەکاردەهێنرێن.

```
/*
This is a multi-line comment.
It can span multiple lines.
*/
```

## گۆڕاوەکان   : Variables

گۆڕاو : بریتیە لەشوێنی پاشەکەوتکردن و هەلگرتنی داتا ، بە کورتی گۆڕاو شوێنی خەزنکردنی داتاکانە ، هەرکاتێک پێویستمان بە داتاکانمان بوو و پیشانمان بداتەوە لەسەر ماڵپەرەکەماندا ئەوا بە ناوی گۆڕاوەکان بانگیان دەکەینەوە .

## جۆری داتاکان Data Type :

PHP یش وەک و هەموو زمانەکانی تر چەندین جۆری داتای هەیە بەلاَم وەک و زمانەکانی تر نیە جۆری داتاکان بنووسیت لەکاتی نووسینی کۆدەکانت ، کاتێک کە گۆڕاوێک دروووست ئەکەیت (تعریف) دەکەیت ، ئەوا لەکاتی پێدانی نرخ بە گۆڕاوەکە لەکاتی Run بوونی کۆدەکانت  Compiler خۆی جۆری داتاکانت بۆ دیاری دەکات . لە PHP دەبێت هێمای $ لە پێشی گۆڕاوەکاندا بنووسین، وە گۆڕاوەکان دەبێت سەرەتا بە _ یان ووشە دەست پێبکات نابێت بە ژمارە یان بە بۆشای(سپەیس)دەست پێبکات .

| جۆری داتاکان | boolean, integer, float, double, String, Array, Object, Resource, Null |
| --- | --- |

| | |
| --- | --- |
| $name = " Ibrahim qadir "; | string |
| $num = 12345; | integer |
| $number = 12,5; | float |
| $name = " Ibrahim qadir 12345"; | double |

لە PHP دا گۆڕاوەکان کاتێک دروووست دەکرێن ئەگەر ناوی گۆڕاوەکانیش وەک یەکتر بێت ئەوا کارەکانت بۆ ئەکات واتە بۆ نموونە دوو گۆڕاوت هەبێت بە ناوی $name  ئەوا هەردووکیان کار ئەکەن بەبێ هەبوونی کێشە و ئیرۆر بەلاَم لە زمانەکانی تر وا نیە بۆ نموونە ئەگەر لە C# بتەوێت دوو گۆڕاو بە یەک ناو دروووست بکەیت ئەوا ئیرۆرت بۆ دروووست ئەبێت و کۆدەکانت کار ناکەن .

تێبینی : نابێت گۆڕاوەکان سەرەتا بە  if یان while یان یەکێک لە مەرجەکانی تر دەست پێبکات .

## مەرج conditions :

- if
- if...else
- if...else if...else
- switch

**زیاتر ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی منداڵی، دەبینین هەندێک فرمانمان وەرگرتووە لەخانەوادەکانمانەوە. تەواو گونجاوە وەکو نمونەیەک بۆ ئەم کارە و تێگەشتن لەگرنگی ئەگەر ئەوە نەبوو ، دەنا ئەوە .لەزمانی ئەوانەوە.**

ئەگەر لەخوێندنی ئەمساڵ دەرچوویت !

پاسکیلت بۆ دەکڕین ....

ئەگەرنا. هیچت بۆ ناکڕین...

**لە رستەی If ڕێگە بە جێبەجێکردنی مەرجداری کۆدەکان دەدات. ئەگەر مەرجەکە ڕاست بێت جێبەجێ دەکرێت. واتە لە حاڵەتێک if کاردەکات ئەگەر هاتوو مەرجەکەت ڕاست بێت .**

```
<html>
<body>
<?php
$num = 10;
if ($num < 20) {
 echo "$num Bchuktra la 20 ";
}
?></body>
</html>
```

Output:

```
10 Bchuktra la 20
```

Else جێبەجێ دەبێت ئەگەر هاتوو مەرجەکەت ڕاست بێت یان هەلە ، بلۆکێکی کۆد جێبەجێ دەکات ئەگەر مەرجە دیاریکراوەکە ڕاست بێت و بلۆکێکی تری کۆد ئەگەر مەرجەکە هەڵە بێت.

```
<html>
<body>
<?php
$num = 30;
if ($num < 20) {
  echo "$num Bchuktra la 20 ";
}else
{
 echo "$num Gawratra la 20 ";
}
?>
</body>
</html>
```

Output:

```
30 Gawratra la 20
```

لە ڕێگای If else If دەتوانین چەندین مەرج بە یەکەوە بنووسین و کاتێک مەرجێک لە کۆدێک ڕاست نەبێت ئەوا دەچێت بۆ سەر مەرجێکی تر .

```
<html>
<body>
$num = -10;
if ($num < 20) {
  echo "$num Bchuktra la 20 ";
} elseif ($num > 20) {
  echo "$num Gawratra la 20";
} else {
  echo "krdaraka halaya";
}
?>
</body>
</html>
```

Output:

```
10 Bchuktra la 20
```

Switch ئەویش وەک و if else if کاردەکات دەتوانین چەندین مەرج بەیەکەوە بنووسین لە حالەتێک دا کامە مەرج راست بوو ئەو مەرجە جێبەجێ دەکات .

```
<?php
$num = 11;
switch ($num) {
  case "9":
   echo "zhmaraka bretya la 9";
   break;
     case "10":
   echo "zhmaraka bretya la 10";
   break;
     case "11":
   echo "zhmaraka bretya la 11";
   break;
  default:
   echo "zhmaraka halaya";
}
?>
```

Output:

```
zhmaraka bretya la 11
```

## ئەلقەکان Loop :

- `for`
- `while`
- `do...while`
- `foreach`

**ئەم جۆرە لووپ کردنە لەهەرە باوترین جۆرەکانیەتی، وە پێکهاتووە لە سێ بەش .**

```
<?php
for (Despek; marjaka ;  zeadkrdn ya kamkrdn)
{
   Lerada statementakan danusen ;
}
?>
```

**بۆ نموونە :**

```
<?php
for ($x = 1; $x <= 3; $x++) {
  echo "zhmaraka bretya la: $x <br>";
}
?>
```

Output :

```
zhmaraka bretya la: 1
zhmaraka bretya la: 2
zhmaraka bretya la: 3
```

# While

ئەمەیان لەزۆر ڕووەوە هەر لە FORدەچێت بەڵام لەچەند خاڵێکدا لەیەک جیاوازن کەبەخوێندنەوە و نمونەی زیاتر تێیان دەگەین. وەکو پێناسەیەکی گستی ئەم جۆرە لووپکردنە لەسەرەوە دەستپێدەکات کەتەنها یەک کردە/فرمان لەخۆ دەگرێت. بەدوایدا پشکنینی سەر دێت، ئەگەر کاتێک نرخەکە وەڵامی TRUE بێت ئەوە بەردەوام دەبێت تاوەکو دەگاتە FALSE ئیتر ئەم جۆرە لووپکردنەوە دەوەستێت و باز دەدات بۆ خشتەی دوای خۆی. جیاوازیەکی بەرچاوی لەگەڵ FORـدا ئەوەیە، ئەم لووپکردنە کاتێک دەکرێت کەژمارە کردەکان پێشتر نەزانرابێت، هەرچی FORلەبڕگەی دووەمدا ئاستی خۆدووبارەکردنەوە دیاری دەکرێت. بابێن تەماشای توخمی WHILEبکەین کەچەندە لەگەڵ ئەوەی پێشی جیاوازە .

```
<?php
while  (marjaka)
 {
       Lerada statementakan danusen ;
       Nrxaka++ yan -- ;
}
?>
```

بۆ نموونە :

```
<?php
$x = 1;
while($x <= 3) {
  echo "zhmaraka bretya la : $x <br>";
  $x++;
}
?>
```

Output :

```
zhmaraka bretya la: 1
zhmaraka bretya la: 2
zhmaraka bretya la: 3
```

## Do ….. while

ئەمە دەتوانین بڵێین لەیەکچوونێکی تەواوی لەگەڵ while هەیە، بەڵام ئەمەیان جارێک کاردەکات دواتر دەچێت بۆسەر مەرجەکە ، ئەگەر FALSEبوو ئەوە ئەم ئاڵقەیە کۆتایی دێت و بەپێچوانەشەوە خۆی دووبارە دەکاتەوە تاوەکو دەگاتەوە .FALSEسەرەتا باتوخمی ئەم شێوە ئاڵقەیە وەربگرین:

```
<?php
do
{
  Lerada statementakan danusen;
Nrxaka++ yan -- ;
} while (marjaka);
?>
```

بۆ نموونە :

```
<?php
$x = 1;
do {
  echo "zhmaraka bretya la : $x <br>";
  $x++;
} while ($x <= 3);
?>
```

Output :

```
zhmaraka bretya la: 1
zhmaraka bretya la: 2
zhmaraka bretya la: 3
```

## : Foreach

ئەم جۆرە زۆر تایبەتە بەڕیزەکان Array وە زۆرگونجاو و ڕێکە لەگەڵیاندا. ئەم جۆرە ئاڵقیە بە کلیلەوشەی foreach دەستپێدەکات و بەدوای خۆیدا کەماوەیەکی چەماوەی لەنێوانیاندا کەتیایدا گۆڕاوەکانی ڕیزەکان Array لەخۆدەگرێت. لەپاشدا کلیلەوشەی as دێت لەگۆڕاوێکی نوێدا.

بانمونەی توخمێکی foreach وەربگرین:

```
<?php
foreach ($array as $value)
{
  Lerada statementakan danusen;
}
?>
```

بۆ نموونە :

```
<?php
$name = array("Ibrahim", "Qadir", "Mustafa");
foreach ($name  as  $fullname) {
 echo $fullname." ";
}
?>
```

Output :

```
Ibrahim Qadir Mustafa
```

## ریزەکان Array :

لە هەرە خەسڵەتە گرنگەکانی زمانە بزۆکەکانە و لەزمانی PHP دا گرنگیەکی تایبەتی هەیە. وەیەکیکە لەکۆڵەکەکانی دارشتن بەم زمانە. ریزەکان لەزمانی PHPـدا بەکلیلەوشەی Arrayدەست پێدەکات لەنێو کەوانەدا نرخەکان و بەفاریزە لەیەکتریان جودا دەکرێتەوە وەکو پارامێتەر ، سێ جۆر لە ئەڵقەکانمان هەن .

- Indexed Array
- Associative Arrays
- Multidimensional Arrays

لە یەکەم جۆر کە index array یە چەند نرخێک دەدەین بە array یەکەمان دواتر لە ریگای index بانگیان دەکەینەوە . بۆ نموونە :

```
<?php
$cars = array("Volvo", "BMW", "Toyota");
echo "I like " . $cars[0] . ", " . $cars[1] . " and " . $cars[2] . ".";
?>
```

Output :

```
I like Volvo, BMW and Toyota.
```

جۆری دووەم کە بریتیە لە Associative Arrays ئەویان لە ریگای ID بانگیان دەکەینەوە و لە نێو Array ئایدی دەنووسین لەگەل نرخەکانیان ، بۆ نموونە :

```
<?php
$age = array("Peter"=>"35", "Ben"=>"37", "Joe"=>"43");
echo "Peter is " . $age['Peter'] . " years old.";
?>
```

Output :

```
Peter is 35 years old.
```

جۆری سێیەم لە Array بریتیە لە Multidimensional Arrays ئەو جۆرەیان پێک دێت لە چەند ریزبەندیەکی جیاواز و لە ناو یەک ریزبەندی دەنوسرێنەوە واتە ئەرێی لە نێو ئەرێی ، بۆ نموونە :

```
<?php
$cars = array (array("Volvo",22,18),array("BMW",15,13),array("Saab",5,2),array("Land Rover",17,15));
echo $cars[0][0].": In stock: ".$cars[0][1].", sold: ".$cars[0][2];
?>
```

Output :

```
Volvo: In stock: 22, sold: 18.
```

## Include

include : بەکاردێت بۆ وەرگرتن و هەڵسەنگاندنی پەڕگەیەکی دیاریکراو لە کاتی جێبەجێکردنی کۆدەکاندا . زۆرجار بەکاردێت بۆ وەرگرتنی ئەو فایلانەی کە فەنکشن، گۆڕاو ، یان کۆدیان تێدایە کە دەتەوێت دووبارە بەکاریان بهێنیتەوە لە سەرانسەری چەندین کۆدا.

```
<?php
include 'config.php';
?>
```

بۆ نموونە کاتێک کە فایلێکمان هەیە بە ناوی config.php ئەوا دەتوانین لە چەندین فایلی تر بەکاری بهێنینەوە تەنها بە بانگکردنی ناوی فایلەکە و نوسینی ووشەی include لە پێش نوی فایلەکە .

## دەرئەنجام :

PHP زمانێکی سکریپتی گشتگیر و بەهێزە کە بەدرێژایی ساڵان ناوبانگێکی زۆری بەدەستهێناوە. بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکاردێت بۆ پەرەپێدانی لاپەڕەی وێبی داینامیکی، بەرنامەکانی وێب، و سیستەمی بەڕێوەبردنی ناوەڕۆک. یەکێک لە هۆکارەکانی ئەوەی کە PHP زۆر بەناوبانگە ئەوەیە کە زمانێکی سەرچاوە کراوەیە ، ئەمەش واتە ئازادە لە بەکارهێنان و دەستکاریکردن و دابەشکردن. سادەیی و ئاسانکاری بەکارهێنانی PHP وای لێدەکات ببێتە هەڵبژاردەیەکی ئایدیاڵ بۆ کەسانی سەرەتایی کە تازە دەستیان بە بەرنامەسازی کردووە . ڕستەسازییەکی ڕاستەوخۆی هەیە، واتە دەتوانیت بە خێرایی و بە ئاسانی کۆد بنووسیت. سەرەڕای ئەوەش، PHP لەگەڵ زۆربەی سیستەمی کارپێکردن و وێب سێرڤەرەکاندا دەگونجێت، ئەمەش واتە دەتوانرێت لەسەر نزیکەی هەر پلاتفۆرمێک بەکاربهێنرێت. بێ دەرەنجام، PHP زمانێکی سکریپتکردنی گشتگیر و متمانەپێکراوە کە بووەتە هەڵبژاردنی سەرەکی بۆ گەشەپێدەرانی وێب لە سەرانسەری جیهان. سروشتی سەرچاوە کراوەی، ئاسانکاری بەکارهێنان، و کتێبخانەی بەرفراوانی فەنکشن و مۆدیولەکانی وای لێدەکات ببێتە هەڵبژاردەیەکی ئایدیاڵ بۆ دروستکردنی بەرنامەی وێبی داینامیکی و ئاڵۆز. جا تۆ کەسێکی سەرەتایی بیت یان گەشەپێدەرێکی بە ئەزموون .

## سەرچاوەکان :


1. (Apiag, Christian Paul W., 2022)
2. (Abed, Sudad H., 2020)
3. (w3schools, 2023)

# PHP چیە ؟

PHP کورتکراوەی Hypertext Preprocessor زمانێکی بەرنامەسازی زۆر بەناوبانگە بۆ پەرەپێدانی ماڵپەڕ و بەرنامەکانی وێب. زمانێکی بەرنامەسازی سەرچاوە کراوە و ئامانجی گشتییە و لە بنەڕەتدا بۆ گەشەپێدەرانی وێب دروستکراوە. PHP لە سەرەتادا لەلایەن گەشەپێدەرێکی دانیمارکی بەناوی Rasmus Lerdorf پەرەی پێدراوە. دواتر بوو بە زمانێکی بەرنامەسازی سەرچاوە کراوە.

تەنانەت هەندێک کەس کورتکراوەی PHP بە Personal Home Page لێکدەدەنەوە. بە زمانی سکریپتکردن بەو مانایە ناودەبرێت کە کاتێک وێبگەڕێک داوای لاپەڕەیەکی PHP لە سێرڤەرەوە دەکات، کۆدەکانی PHP لە لاپەڕەکەدا لەلایەن وەرگێڕی PHP (کۆمپایەر)ی لای سێرڤەرەوە لە کاتی کارکردندا لێکدەدرێنەوە پێش ئەوەی بگات بە وێب سێرڤەرەکە، ئەمەش پەرەپێدانی بەرنامەکان ئاسان دەکات چونکە گەشەپێدەر پێویستی بە کۆمپایڵ و دووبارە کۆکردنەوەی بەرنامەکانی php نییە، هەر جارێک گۆڕانکاری لە سکریپت کۆدەکاندا دەکات. فایلەکانی PHP بە شێوەی کۆدی سەرچاوە خۆی لە وێب سێرڤەرەکەدا هەڵدەگیرێن.

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە کۆدەکانی php هەمیشە لەسەر سێرڤەر جێبەجێ دەکرێن و لەسەر وێبگەڕی ئاسای جێبەجێ ناکرێن، کۆدەکانی PHP هەمیشە لە لایەنی سێرڤەرەوە جێبەجێ دەکرێن و وێبگەڕی ئاسای تەنها ئەنجامی جێبەجێکردنی بەرنامە بەدەست دەهێنێت و لێرەوە بەکارهێنەر هەرگیز ناتوانێت کۆدی سەرچاوەی ئەسڵی PHP ببینێت.

